

كورته باسێك له:

# زانیارییه‌كانی قورئان

نووسینی:
حسن محمد امین پێنجوێنی






زنجیرەی ( ١٠٠ ) کتێبی کوردی
ژمارە ( ١٥ )

# کورتە باسێك لە
# زانیاریەکانی قورئان

نووسینی :
حسن محمد امین پێنجوینی

چاپی یەکەم
١٤١٨ ك    ١٩٩٧ ز

بسم الله الرحمن الرحيم


- ناوی کتێب ، کورتە باسێک لە زانیاریەکانی قورئان
- نووسینی ، مامۆستا حسن پێنجوێنی
- چاپی یەکەم ١٤١٨ک ١٩٩٧ز
- تیراژ ، ٢٠٠٠دانە
- مافی چاپ پارێزراوە بۆ نووسەری رۆشنبیر
- ژمارەی سپاردن ( 246 ) ساڵی ١٩٩٧

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وآله وصحبه وسلم

خوێنەری بەڕێز :

... لە ساڵی ١٩٨٠دا خولیای نووسینی بابەتێک کەوتە سەرم لە بارەی قورئانەوە لە ماوەی دوو ساڵدا بابەتەکەم لا گەڵاڵە بوو ـ هێشتا پاک نووسم نەکردبوو ، قەدەری خوا وابوو کە بەهۆی ڕووداوی ئۆتۆمبێلەوە ڕانێکم وردە بیرێ ماوەی ساڵێکی ڕەبەق لەجێگادا بکەوم، ئەڵبەتە خوا شتێکی (تەقدیر) کردووە کە ئێمە ئاگامان لێی نییە، شتێکی ئاشکرایە قەدەری خوا هەمووی خێرە، بگرە ئەوەشی کە لە ڕواڵەتدا زەحمەت و ئازارە لە ناوەڕۆکدا هەر خێرە.

سوپاس بێپایان بۆ خوا لەسەر ئەم هەموو ناز و نیعمەت و بەخششەی..

لەم ماوەیەدا ئەو بابە قورئانییانەی کە گەڵاڵە کرابوو هێشتا پاک نووس نەکرابوون.. پاک نووس کراو لەچاپیش دراو کەوتە دەستی خوێنەران بەناوی (ئێستا دڵنیام) لەو کتێبەدا چەند بابەتێک باس نەکرابوون پاش بەچاپ گەیاندنی بیرم کەوتەوە. کەباس کردنیان پێویستە. لەبەرئەوەی چاپ کردنەکەی ئەو زۆری دەویست. ویستم ئەم بابەتانە بەسەربەخۆ لە چاپ بدەم تا فرسەتێک دەرەخسێ بەویستی خوا ..؟

ئیتر هیوادارم خوا بیکاتە زەخیرەی پاشەڕۆژم و سودیشی هەبێ بۆ میللەتەکەم.

حەسەن پێنجوێنی
ملێملکی.

# قورئان چەند واتای هەیە ؟!

... قورئان چاووگی کرداری (قرأ)ەیە لەسەر کێشی (فعلان)، وەک (غفران)و (شکران) وشەی قورئان سێ واتای هەیە:

١ / **کۆکردنەوەو لکاندنی بەیەکەوە.** وەک دەڵێن: (قرأه، قرءا، قرآنا) واتە: کۆی کردەوە بە کۆکردنەوەو پێکەوەلکاندن، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ( هەواڵی ئەتەوەکانی پێش خۆتانی تێدایەو هەواڵی خۆیشتان و حوکمی نێوانتانی تێدایە).[1]

.. پێغەمبەریش ﷺ وەصفی قورئانی کردووە، بەم پێیە قورئان ئە وخاڵانەی کۆکردۆتەوە کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردن.

.. وە هەروەها دەشگونجێ کۆکەرەوەی سوورەتەکانی بێ چونکە قورئان (١١٤) سورەتی تێدایە کۆی کردوونەتەوەو پێکەوەی لکاندوون..!

٢ / **بە واتای خوێندنەوە** دەڵێن : ( قرأه قراءة وقرآنا) . واتە: نووسراوەکەی بە خوێندنەوە خوێندەوەو، لە قورئاندا بەم واتایە هاتووە هەروەک دەفەرموێ: ( فإذا قرأناه فاتبع قرآنه) (القيامة/١٧). واتە *ئینجا کە خوێندمانەوە تۆیش بکەوە شوێن خوێندنەوەکە. لەم ئایەتەدا وشەی قورئان بە واتای خوێندنەوەیە..*

٣ / **بە واتای (ناو) بۆ ئەو کتێبە پیرۆزەیش هاتووە.** ئەوەتە خوا ﷻ دەفەرموێ: (إن هذا القرآن يهدي للتي هي أقوم) (الإسراء/٩). واتە: *بێگومان ئەم قورئانە -ئەو کتێبە پیرۆزەی کە خوا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ- ڕێنموونی خەڵکی دەکات بۆ ڕاست ترین و چاک ترین ڕێگە..*

... هەروەها خوای گەورە ﷻ دەفەرموێ: ( وإذا قرئ القرآن فاستمعوا له وأنصتوا لعلكم ترحمون) (الأعراف/٢٠٤).

واتە: *ئەگەر قورئان خوێنرایەوە ئێوەیش گوێی بۆ بگرن و بێدەنگ بن..*

.. لەم دوو جێگەیەدا قورئان بە واتای سێهەم هاتووە کە بریتییە لەو کتێبە پیرۆزەی کە خوا ناردوویەتی بۆ محمد ﷺ.

---

[1] واتای فەرموودەیەکی پێغەمبەرە ﷺ کە (ترمذي) ڕیوایەتی دەکات. وەرگیراوە لە (النبأ العظيم) لاپەرە/١٣.

# پێناسەی قورئان

زانایانی قورئان شناس بەم جۆرە پێناسەی قورئانیان کردووە:

*قورئان ئەو فەرموودە خواییەیە کە بە وەحی خوا ناردوویەتی بۆ محمد ﷺ و تەنیا سوورەتێکی (معجزة)یە. واتە کەس ناتوانێ وێنەی سوورەتێکی دابنێ -بەشێوەی (موتەواتەر)[1] پێمان گەیشتووەو خوێندنەوەکەی عیبادەت و پەرستشەو دوایین کتێبی ئاسمانییە)[2] ...*

.. ئەم پێناسەیە، تەورات و ئینجیل و زەبوورو صوحوف بە قورئان نادرێنە قەڵەم چونکە خوا بۆ پێغەمبەرانی تری ناردوون و نەیناردوون بۆ محمد ﷺ. هەروەها (حدیث)ی قدسي و حدیث النبي) بە قورئان دانانرێن چونکە خوێندنیان عیبادەت نییە[3]. واتە لەمڕۆژدا ناوترێن لەباتی قورئان. بەڵام قەیدی (معجزة) کتێبە پێشووەکان و فەرموودەی قودسیو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لە بازنەکەدا دەچنە دەرەوە چونکە ئەوانە هیچیان بۆ (تحدي) نەهاتوون..!!

## سرووش ( الوحي )

.. لەسەرەتای باسەکەمانەوە پێناسەی قورئانمان کردو گوتمان (خوا بە وەحی ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ با بزانین (وەحی) چ واتایەکی هەیەو شێوەو چۆنیەتی هاتنەخوارەوەی چۆن بووە؟!!.

.. وەحی وشەیەکی عەرەبییە: *واتە گەیاندنی ئەو زانیاریو زانستییەی کە خوا بیەوێ فێری پێغەمبەرانی بکات..* وە

---

[1] متواتر (موتەواتەر) وشەیەکی عەرەبییەو واتە کۆمەڵێکی زۆرە لە کۆمەڵێکی زۆری وەرگرتبێ تا دەگاتە دوایین کەس. قورئانیش بۆیە پێی دەڵێن موتەواتەر چونکە کۆمەڵێکی زۆر لە دەمی پێغەمبەریان ﷺ بیستووەو، کۆمەڵێکی زۆری تریش لەدەمی ئەوانیان بیستووە بەو جۆرەی کە پێغەمبەر ﷺ لە دەمی هاتووەتەدەر کۆمەڵ بە کۆمەڵ گەیەنراوە تا گەیشتووەتە ئێمە بێ گۆڕان و بێ زیادوکەم !!؟

[2] ئەم پێناسەیە لە کتێبی (النبأ العظيم) د. محمد عبد الله دراز و (روح الدين الإسلامي) مامۆستا عفيف عبدالفتاح طبارة وەرگرتووە.

[3] واتە جگە لە قورئان فەرمایشتیان پێ تەکراوە بە خوێندنەوەی. هەر لەسەر ئەوەش بوو نووسینەوە بەشێوەیەکی گشتی دواکەوت..!!

لەکوردەواریدا پێی دەوترێ (سرووش) ئەم وشەیە هەرچەندە لەکوردیدابەکاردەهێنرێ بەڵام سەرچاوەکەی فارسییە جا لەبەرئەوەی لەمەدا حەفتاو پێنجی موسڵمانان لە وشەی وەحی باشتر تێدەگەن تا وشەی (سرووش) و لەهەمان کاتدا وشەیەکی کوردی رەسەنیشە وشەی وەحی لە نووسینەکەماندا بەکاردەهێنین:

*بەم جۆرانەی خوارەوەو بەم شێوانە وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتووە :*

**١ / خەونی راست ،**

خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: ( أول مابدئ به رسول الله ﷺ من الوحي الرؤيا الصالحة في النوم، فكان لا يرى رؤيا إلا جاءت كفلق الصبح) -رواه البخاري في بدء الوحي-

*واتە: یەکەمجار کە وەحی بۆ پێغەمبەری خوا هاتووە بەشێوەی خەونی راست بووە، هەر خەونێکی لەکاتی نوستندا بیبینیایە وەک سپیایی بەرەبەیان دەهاتەدیو رووی دەدا.*

**٢ / لەشێوەی دەنگی زەنگ ،**

ئەم حاڵەتەیان وەک (مۆرس)ی جیهازی لاسلکی وابووە لەلای پێغەمبەر ﷺ لەهەموو جۆرەکانی تری وەحی گرانتر بووە ئەوەبوو (حارثی کوری هشام) پرسیاری کردوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وەحیت چۆن بۆ دێت؟! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ( أحيانا يأتيني مثل صلصلة الجرس وهو أشده علي فيفصم عني وقد وعيت عنه ما قال) -رواه البخاري في بدء الوحي-

*واتە: جاری وا دەبێ لەشێوەی دەنگی زەنگدا وەحیم بۆ دێت و ئەم حاڵەتەش لام گرانترە لەحاڵەتەکانی تر. کاتێ لێم جیادەبێتەوە هەرچی وتووە لێی حاڵی بووم و لەبەرم کردووە..*

**٣ / فریشتە لەشێوەی خۆیدا بۆی دێنێت**

ئەوە بوو لەسەرەتای وەحییەوە پێغەمبەر ﷺ لەئەشکەوتی (حراء)دا، فریشتەی وەحی هات بۆ لای و چەند جارێک داوای لێکرد بخوێنێت لەوەڵامدا دەیفەرموو: من خوێندەوار نیم چۆن بخوێنم. لەئەنجامدا باوەش بە پێغەمبەردا دەکات و دەیگوشێ بەخۆیەوە لەسەری سێهەم جاردا بەری دەدا و سەرەتای سوورەتی (علق)ای پێ دەڵێ. (-رواه البخاري في بدء الوحي-). سوورەتی (علق) لەم حاڵەتەدا لەشێوەی خۆیا هاتووە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ.

**٤ / فریشته له شێوەیەکی تر جیاواز له شێوەی خۆی وەحی بۆ هێناوە**

وەکو ئەو حاڵەتەی کە حەزرەتی عومەر لە واتای ئیمان و ئیسلام و ئیحساندا بۆمان دەگێڕێتەوە لەشێوەی پیاوێکی غەریب و نامۆدا دێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و چۆکە دەنێ بە چۆکیەوەو پرسیاری لێدەکات و دەشڵێ ڕاست دەکەی، عومەر سەری سوڕدەمێنێ پاش ئەوەی کە هەڵدەستێت و دەڕوات پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بۆم بگێڕنەوە بەڵام کەس نایبینن لەو شێوەیەو لەهیچ شوێنێکدا نییە ئینجا دەفەرموێ: (هذا جبريل جاء يعلم الناس دينهم)[1].

*واتە: ئەوە جبرەئیل بوو هاتبوو تا خەڵکی فێری ئاینەکەیان بکات. هەروەک لەچەند فەرموودەی تردا هاتووە کە لە شێوەی (دحية الكلبي)[2]دا فریشتەی وەحی هاتووە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ...[3]*

**٥ / فریشتەی وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ هێناوە، بەڵام نەیبینیوەولە قسەکانی حاڵی بووەو گوێی لەدەنگی بووە.** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن روح القدس نفث في روعي أنه لن تموت نفس حتى تستكمل رزقها فاتقوا الله وأجملوا في الطلب ولا يحملنكم إستبطاء الرزق على أن تطلبوه بمعصية الله فإن ما عند الله لا يطلب إلا بطاعته)[4].

*واتە: بێگومان (روح القدس) کە جبرەئیلە خستیە دڵمەوەو پێی وتم کە هیچ کەس نامرێت تا ڕزقی خۆی تەواو نەکات، ئەوابوو لەخواپترسن وە بە پاکی و بە جوانی هەوڵی بۆ بدەن، دواکەوتنی ڕزق واتان لێ نەکات کە بەشێوەی سەرپێچی‌کردن لەفەرمانی خوا هەوڵی بۆ بدەن، ئەوەی لای خودایە بەگوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری ئەو دەست دەخرێت و داوادەکرێت.*

[1] رواه البخاري في باب سؤال جبريل النبي عليه السلام.
[2] دحية الكلبي: ناوی صەحابییەکە کە زۆرشێوەی جوان بووە.
[3] لە فەرموودەیەکدا کە (بخاری و مسلم و ترمذی) ڕیوایەتیان کردووە لە عائیشەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (..... وأحيانا يتمثل لي الملك رجلا فيكلمني فأعي ما يقول..)
[4] أخرجه الحاكم نقلا عن (الإتقان في علوم القرآن) ٢٩/١.

٦ / **هەندێجار بە وەسیلەی فریشتەی خواوە** وەحی بۆ ناردووە وە ڕاستەوخۆ لە دڵی پێغەمبەری ﷺ هاویشتووەو ئەمەش لە خوڕیەوە نیگا (إلهام) جیای‌کردۆتەوە بەو جۆرە کە زانیویەتی سەرچاوەکەی لە کێوەیە؟!

٧ / **جاری وایش دەبێ وەحی بەشێوەی قسەکردنی ڕاستەوخۆی خوا دەبێت لەگەڵ پێغەمبەردا** وەک قسەکردنی خوا لەگەڵ پێغەمبەری خۆماندا ﷺ لە شەوی (میعراج)دا و هەروەها قسەکردنی خوا لەگەڵ حەزرەتی مووسادا لەکێوی (طور) قورئانیش دەفەرموێ: ((وما كان لبشر أن يكلمه الله إلا وحيا أو من وراء حجاب أو يرسل رسولا فيوحي بإذنه ما يشاء إنه عليم حكيم)).

واتە: *(بەیەکێ لەم سێ جۆرە نەبێ) بۆ هیچ ئادەمیزادێک نییە خوا قسەی لەگەڵ بکات بە وەحی نەبێت واتە جگە لە: ١) هاویشتنە ناو دڵییەوە بێئەوەی کەسێ لەنێوانندا هەبێت. ٢) یا لەپشتی پەردەوە وەک قسەکردنی خوا لەگەڵ پێغەمبەری خۆمان لە شەوی میعراجدا و قسەکردنی لەکێوی طور لەگەڵ مووسادا ﷺ ٣) یا ناردنی فریشتەی وەحی فریشتە دەنێرێو فەرموودەی خوا دەگەیەنێ بە ئیزنی خواو ئەوەی کە خوا بیەوێ نەک هەر لە خۆیەوە بڕوات و بێپرس - بێگومان خوا بەرزەو کار بەجێیشە..*

.. بەڵێ بەم حەوت شێوەیە وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتووە، یەکەم خەوی ڕاست، دووەهەم هاتنی فریشتە بۆ لای لەسەر شێوەی خۆی، سێیەم فریشتە لەشێوەیەکی تردا هاتووە بۆ لای، چوارەم خوا خستوویەتیە دڵییەوە بێئەوەی هیچ کەسێک و فریشتەیەک لەنێواندا بووبێ، پێنجەم قسەکردنی ڕاستەوخۆی خودا لەگەڵیا وەک فەرزکردنی پێنج نوێژەکە لەشەوی میعراجدا، شەشەم لەشێوەی دەنگی زەنگدا ئەویش وەک مۆرسی جیهازی بێتەل، حەوتەم فریشتە وەحی بۆ هێناوە بەڵام خۆی پیشان نەداوە. ئەمەیان جیاوازە لەوەیان کە خوا خۆی خستویەتە دڵییەوە، چونکە لەمەوتەمەدا گوێی لە قسەی فریشتە بووەو دەنگی بیستووە بەڵام خۆی نەبینیوە...

## حاڵی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی هاتنی وەحیدا

.. کاتێ پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ هاتووە ڕواڵەتێکی تایبەت لەسەر دەم و چاویا پەیدابووە هەرکەس سەرنجی دابوویە بینیویەتی... حەزرەتی عائیشە ﵂ دەڵێت: (ولقد رأيته ينزل عليه الوحي في اليوم الشديد البرد فيفصم عنه وإن جبينه ليتفصد عرقا)[1].

واتە: *بێگومان من بینیومە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژێکی زۆر ساردا کە وەحی بۆ هاتووە ناوچاوی عارەقی لێ دەتکا..*

.. هەروەها ڕەنگی سوور بوەتەوەو ڕەنگی تێک چووەو لەشی زۆر قورس و گران بووە ئەگەر لەو کاتی وەحییەدا ڕانی لەسەر ڕانی یەکێکی تر بوایە لەوانەبوو ڕانی ئەو کەسەی تر وورد ببوایە. خۆ ئەگەر لەکاتێکدا کە بەسواری وڵاخ بووە وەحی بۆ بهاتایە وڵاخەکە چۆکی دادەداو دەکەوت. ئەوانەی لە دەوری بوون گوێیان لەدەنگێک دەبووە وەک گیزەگیزی هەنگ، پاش تەواوبوونی وەحی ئەو حاڵەتانەی نەدەماو دەچووەوە دۆخی ئاسایی خۆی و قورئانی بۆ دەخوێندنەوە، وە نەبێ کاتێکی دیاریکراو هەبووبێ بۆ هاتنی وەحی.. لەکاتی ڕۆیشتن یا دانیشتن یا ڕاوەستان یا سواری وڵاخ و بەیانیان یا ئێواران ئەم حاڵەتانە لێی ڕوودەدا جا قسەی بۆ دوژمن یا بۆ دۆست بکردایە بە کوتوپڕ ڕووی تێدەکردو کوت و پڕیش لادەچوو[2]...

## نموونەیەک

لەوانەیە هەندێکەس سەریان بسوڕمێنێ و بڵێن چۆن فریشتە دەبینرێ؟ چۆن دەنگێک هەبێ ئێمە نەیبیستین وە یا بەشێوەیەکی زەقتر بڵێین: چۆن محمد ﷺ شتێ ببینێ و ئێمە نەیبینین؟ چۆن دەنگێ ببیستێ کە ئێمە نەیبیستین.. زۆر جێگەی خۆیەتی لەو سەرسامییەی ئەوان ئێمەش سەرمان سوڕبمێنێ چونکە ئەگەر ئەم قسانە لەسەردەمە کۆنەکاندا برایە بەهەرحاڵ جێگەی خۆی بوو بەڵام ئەمڕۆ کەی جێگەی زۆریەتی و کەی مەعقوولە؟ لەگەڵ ئەوەدا کە سەرزەوی پڕەتی لە حەقیقەتی زانیاری نەبینراو ڕۆژ بەڕۆژ بە

[1] رواه الشيخان والترمذي.
[2] وەرگیراوە لەکتێبی (النبأ العظيم) ی د. محمد عبدالله دراز / ٧.

نیشانەو بەڵگەدا ئامادەبین یان سەلماندنین و ئان بە بوونیاندا بڵێین..

.. تیشکی ژوور وەنەوشەیی و ژێرسووور تیشکی ئێکس (X) هەن و بەکاریشیان دێنین و لەگەڵ ئەوەدا نایانبینین...

.. یا شەپۆلی مۆرسی جیهازی بێتەل ئەوەی لەتەنیشتیا دادەنیشێ تەنها گوێی لە زیکەزیکەو هیچی تر. بەڵام ئەوەی کە فێرکراوە وەک هەموو قسەیەکی ئاسایی وەریدەگرێ...

... خۆ ئەگەر نموونەی ڕوونترت دەوێت تا لەشێوەی وەحی حاڵیت بکات فەرموو ئەوە (ئەزموونی موگناتیسی) واتە خەوڵێخستنی موگناتیسی ئەمەش بریتییە لە بەیەک گەیشتنی دڵ و دەروونی ئادەمیزاد بە هێزێکی بالاتر لە خۆی ڕواڵەتێکی لە ترخەی ئەو ڕواڵەتەی تیا دروست دەکات و چەندەها ئاگاداری و زانیاری تیا نەخش دەکێشێ لەوەیش لە هەست و هۆشیدا نەبوو بێت...

.. لە (خەوڵێخستنی موگناتیسی)دا پیاوێکی ویست پتەو بەهۆی هێزو توانای ویست (إرادة)یەوە دەتوانێت دەسەڵات بەسەر کەسێکی لەخۆی لاوازتردا پەیدا بکات، بە جۆرێک فەرمانی پێ دەکات بخەوێ، ناتوانێ نەخەوێ، بەڵکو خەوێکی وای لێ دەکەوێ ئەگەر دەرزی بکرێ بە لەش و جەستەیدا بەخۆی نازانێ، جەستەی ڕەق دەبێ چاوەڕێی فەرمانی دەبێ و ویستی خۆی لە ویستی بەهێزەکەدا دەتوێتەوە، ئەگەر بە توانادارەکەو بەهێزەکە بەیوێ بیروباوەڕێک یا ڕاو بۆچوونێک لە لاوازەکەدا بچەسپێنێتەوەو نەیهێڵێ، بەتەنها یەک وشە لەبیری دەباتەوە و نایهێڵێ.. بگرە ئەگەر بیەوێ ناوی خۆی لەیاد ببەنەوە ناوێکی تری لێ بنێ و پێی بڵێ: تۆ ناوت ڕزگار نییەو ناوت ئازادە.. کە هەستایەوە ئەو شتە تازەیە لەسەر دڵ و دەروونیدا نەخش دەبێت..

.... جا ئەگەر ئەمە کاری مرۆڤ بێت، دەبێ رات چۆن بێت بەرامبەر بە کەسێک کە لە مرۆڤ بەهێزتر بێت؟؟! جا (تەشبیهی نەبێت) وێنەی ئەو خاوەن هێزە بێ هێزە لە خەوڵێخستنی موگناتیسیدا وەکو ناوێنەی فریشتەی وەحی و پێغەمبەر ﷺ وایە...

## هاتنەخوارەوەی قورئانی پیرۆز

.. قورئانی پیرۆز قسەو فەرمودەی خوایە، خوای گەورە بە گوفتارو فەرموودەی خۆی ناوی بردووە دەفەرموێ: ﴿ وإن احد من المشركين استجارك فأجره حتى يسمع كلام الله ﴾[1].

*واتە: ئەگەر یەکێک لەوانەی کە هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن هانای بۆ هێنایت و داوای پەنای لێ کردیت پەنای بدە تا فەرموودەو گوفتاری خودا دەبیستێ...*

.. لەم ئایەتەدا مەبەست لە گوفتاری خوا (قورئان)ە جوبرەئیل ﷺ لە هێنانی قورئاندا هیچ دەست و توانایەکی نەبووە جگە لە گواستنەوەی لەئاسمانی دنیاوە -بیت العزة- بۆ سەرزەوی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەریش ﷺ هیچ دەسەڵاتێکی لە قورئاندا نەبووە جگە لە گەیاندنی بەخەڵکی، بەو جۆرەی کە جوبرەئیل بۆی هێناوەو بەو جۆرە ئەویش گەیاندوویەتی بە خەڵکی، پێغەمبەر ■ هەروەک گەیەنەری بووە روون کەرەوەشی بە گوفتارو کردار لەئەستۆدا بووە تا بەو بۆنەوە خەڵکی ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە.

... قورئان یەکەم جار لە (لوح المحفوظ)دا نوسراوەو تۆمارکراوە ئەم نوسینەوەیش بە فەرمانی خوا بووە. بەڵام (کەی) و ( چۆن) !!!! ئەوە مەگەر هەر خوا خۆی بزانێ.. خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿ بل هو قرآن مجيد في لوح محفوظ ﴾[2] واتە: *بەڵکو ئەوەی (ئەوان بەدرۆیان دەزانن ) قورئانێکی خاوەن ڕێزەو لە (لەوح)دا نوسراوەتەوە لەوێشدا لە هەموو دەستێکی خراپ پارێزراوە...*

بۆ جاری دووەم خوا فەرمانی داوە سەرانسەری قورئان و بەیەک پارچە بیرێتە ئاسمانی یەکەم -ئاسمانی دنیا- و لەشوێنێکدا کەپێی دەوترێ (بیت العزة) دانرا. تا ئامادەبێ بۆ ناردنی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ زانایان دەفەرموون (نوسخەی ئاسمانی دنیا لەبەر (لوح المحفوظ)دا گیراوەتەوەو نوسخەی (لوح المحفوظ) هەر ماوەتەوە).

---

[1] سورة التوبة / ٦.

[2] سورة البروج / ٢١-٢٢.

ناردنەخوارەوەی قورئان لە (لوح المحفوظ)ەوە بۆ ئاسمانی دنیا قورئان باسی دەکات و دەفەرموێ: (إنا أنزلناه في ليلة مباركة)[3]. واتە: *بێگومان قورئانمان لەشەوێکی پیرۆزدا نارده خوارەوە*...

... ئینجا قورئان ئەو شەوە پیرۆزەمان بۆ دیاریدەکات و دەفەرموێ: (إنا أنزلناه في ليلة القدر)[4]. *بێگومان ئێمە لەشەوی قەدردا قورئانمان ناردۆتە خوارەوە*.. ئینجا خوا بۆمان روون دەکاتەوە کە ئەو شەوە لە چ مانگێکدا بووە دەفەرموێ: (شهر رمضان الذي أنزل فيه القرآن)[5]، واتە *مانگی رەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تیا نێرراوەتە خوارێ*..).

... لەم ئایەتانەوە بۆمان دەرکەوت کەخوا ﷻ لەشەوێکی مانگی رەمەزاندا ئەم قورئانەی ناردۆتە خوارەوەو ئەو شەوەیشی بە (پیرۆزو بەرێز) بە (مبارك)و (قدر) ناو بردووەو هەروەها زانایان دەفەرموون: ( واتای ئەو ئایەتانەی باس کران ئەوە دەگەیەنێ کە قورئان بەیەک پارچە هاتوەتە خوارێ، دەی خۆ هاتنەخوارەوەی بۆ سەر زەوی لەماوەی (٢٣) سالدا بووە، کەوابوو مەبەست لەو ئایەتانە هاتنەخوارەوەی قورئانە بۆ (بيت العزة) لە ئاسمانی یەکەمدا...

لەم بارەوە فەرموودەیەکی (موقوف) لەسەر ابن عباس هەیە کە دەفەرموێت: *لەشەوی قەدردا قورئان بەیەک پارچەیی نێرراوەتە خوارێ بۆ ئاسمانی دنیا، ئینجا لەویوە لەماوەی ٢٣ سالدا هاتوەتە خوارەوە)*[6].

وە هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە قورئان لە (الذكر)کە (لوح المحفوظ) جیاکراوەتەوەو لە (بيت العزة)ی ئاسمانی دنیا دانراوەو جوبرەئیل دەستی پێکردووە بۆ هێنانە خوارەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ[7].

---

[3] سورة الدخان/٣.
[4] سورة القدر / ١ .
[5] سورة البقرة / ١٨٥.
[6] ئەمە دەقی فەرموودەکەیەتی ( عن إبن عباس قال: أنزل القرآن جملة واحدة إلى سماء الدنيا ليلة القدر ثم أنزل بعد ذلك بعشرين سنة). أخرجه الحاكم والبيهقي والنسائي بإسناد صحيح..

## هاتنەخوارەوەی سێیەم

ئەم جارەیان دوایین قۆناغی هاتنەخوارەوەی قورئانە و سەرەتای ئەم هاتنەخوارەوەیش لە مانگی ڕەمەزاندا بوو لەو کاتەدا کە پێغەمبەر ﷺ لە ئەشکەوتی (حراء) گۆشەگیری و خواپەرستی دەکرد، چونکە ئەگەر سەیرێکی کتێبەکانی (سیرە) بکەین دەبینین نووسیویانە هەموو ساڵێک لە مانگی ڕەمەزاندا پێغەمبەر ﷺ گۆشەگیری دەکرد و دەچووە ئەشکەوتی -حراء- پێش ئەوەی ببێ بە پێغەمبەر ...)[1]. وەی خۆ یەکەم جار سەرەتای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیش لە ئەشکەوتی (حراء)دا هات بۆ پێغەمبەر ﷺ. لەماوەی بیست و سێ ساڵدا، بەپێی پێویست خوای گەورە فەرمانی بە جوبرەئیل دەدا و ئەویش لە ئاسمانی دنیاوە دەیهێنایە خوار بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەم هاتنەخوارەوەی قورئانیش بۆ ڕێنموونی خەڵکی بووە، تا لە سەرگەردانییەوە بەرەو ڕزگاری بیبات و سەرکەشەکان ئاگاداربکاتەوە و لەئەنجامی یاخیبوونیان لەخوا بیانترسێنێ و پێیان ڕابگەیەنێ کە ئەم سەرکەشییەتان سەرگەردانییە بەرەو ئازاری بەسوێی دۆزەختان دەبات ئەوەتە خوا دەفەرموێ: (تبارك الذي نزل الفرقان ليكون للعالمين نذيرا)[2]. واتە: *گەورەیی و پیرۆزی بۆ ئەو خوایەیە کە فورقان -قرآن-ی ناردووەتە خوارەوە بۆ سەر عەبدی خۆی تا دانیشتوانی جیهان بترسێنێت لە سزای دۆزەخ..!!*

## شوێن و جێگای هاتنەخوارەوەی ئایەت و سورەتەکان

... سەرەتای هاتنەخوارەوەی قورئان لە مەککەدا دەستی پێکرد کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ لەئەشکەوتی (حراء)دا خواپەرستی

---

[1] عن سعيد بن جبير عن ابن عباس قال فصل القرآن من الذكر فوضع في بيت العزة من سماء الدنيا فجعل جبريل ينزل به على النبي ﷺ أخرجه الحاكم وابن شيبة بإسناد صحيح. ئەم دوو فەرموودەیەم لە کتێبی (الإتقان في علوم القرآن)ی شێخی سیوطی وەرگرتووە.

[2] سورة الفرقان/١.

دەکرە ئەم ئایەتانەی بۆ هاتە خوارەوە ( إقرأ باسم ربك الذي خلق خلق الإنسان من علق إقرأ وربك الأكرم الذي علم بالقلم علم الإنسان ما لم يعلم)[3].

*... واتە: بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروستکردووە، بخوێنەو بزانە کە پەروەردگارت ئەو خوایەیە میهرەبانترو بەخشش لە هەمووشتێ زۆرترە ئەو خوایەی بەهۆی نووسینەوە بەخامە زانیاری پیشانی ئادەمیزاد داو، ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیزانیون)*[4].

.. لە دەوروبەری (٢٣) ساڵدا بەتەواوی قورئان هاتە خوارەوە واتە ماوەی هاتنەخوارەوەی قورئان بەتەواوی نزیکەی (٢٣) ساڵ بووە...

قورئــان بریتییــە لــە (١١٤) ســوورەت (شــێخی ســیوطي) (رەحمەتی خــوای لێبــێ) لــەکتێبی (الإتقــان)[5]دا واتــای زۆری (سورة)ی بۆ کردووین وا ئێمەش هەندێکی دەخەینە پێش چاوی ئێوەی ئازیز...

هەندێکە دەڵێن سوورە بنچینەکەی (سؤر)ە (سؤر)یش واتە ئەو ئەندازە ئاوەی لە جام و پەرداخ دا دەمێنێتەوە دوای خواردنەوە. چۆن سۆر بەشێکە لە ئاوی پەرداخ، سورەتیش بەشێکە لە قورئان..

. هەندێکی تر دەڵێن (سورة) لە (سور البناء)ەوە هاتووە، واتە چۆن شووورای خانوو یا حەسارو پەرژینی خانوو سنووری خانووەکە دیاری دەکات ئاوەها (سورة)یش سنووری ئایەتەکان و ژمارەیان دیاری‌دەکات.

.. هەندێکی‌تر گوتویانە لە (سوار)ەوە هاتووە چۆن بازنگە و خرخاڵ دەوری مەچەک دەدات سورەتیش ئاوەها دەوری ئایەتەکان دەدات..

- هەندێکی تر پێیان وایە (سورة) لــە (تسور)ەوە هاتووە بە واتای هەڵزنان و سەرکەوتن و پێکە هاتووەی (إذ تسور المحراب)[6].

---

[3] سورة العلق / ١-٥.
[4] تفسيری نامی بەرگی ٧/ ٢٨١.
[5] تفسيری نامی بەرگی ٥٢/١.
[6] سورە ص / ٢١ ، واتە كاتێ هەڵزنان و سەرکەوتن بەمیحرابدا خانەکەدا.

ئەم واتایەی هەیە (جمهیری) گوتویەتی پێناسەی سوورەت بەم جۆرەیە: بەشێکە لە قورئان و بریتییە لەچەندەها ئایەت و سەرەتاو کۆتایی هەیە. لای خوارەوەکەی، لە سێ ئایەت پێک هاتووەو لای ژوورەوەکەیشی دووسەدو هەشتاو شەش ئایەتە (٢٨٦)... هەر سوورەتێک ناوێک یا چەند ناوێکی تایبەتی خۆی هەیەو دانانی ئەم ناوانەش گۆترەکاری نەبووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستراون، ئەم سوورەتانەش ناوەکانیان لە وشەیەکی سەرەتایی سوورەتەکەوە وەک: (الذاریات)، و (النازعات)، و (الضحی) وەرگیراوە یا بەناوی شتێکەوە کە زۆر دووبارە بووبێتەوە وەک (البقرة) و (الطلاق) یا لە وشەیەکی زۆر ئاشکراو زەقەوە کە لە سوورەتەکەدا هەیە وەک (النحل) و (النمل) و (الحمد)[1] ... هتد.

## سوورەتەکانی قورئان بەپێی هاتنەخوارەوەیان

سوورەتەکانی قورئان بەپێی هاتنەخوارەوەیان دەکرێن بە دوو بەشەوە: ئەوەی لەپێش کۆچ کردن (هجرة)دا هاتبێتە خوارەوە پێی دەوترێ (مەککی) (المکي) و ئەوەیش لەپاش کۆچ کردنەوە هاتبێتە خوارەوە پێی دەوترێت (مەدەنی) (المدني).

## بۆچی قورئان بەیەکجار نەهاتە خوارێ

ئەمە پرسیارێکە دەکرێت بۆچی تەواوی قورئان بەیەکجار نەنێررایە خوارێ بۆ پێغەمبەر ﷺ ؟؟!!!

ئەم پرسیارە تازەو نوێ نییە!!.. بەڵکو لەگەڵ یەکەم دابەزینی سەرەتای ئایەتەکانی قورئاندا و رووناک بوونەوەی سەرزەوی بە نووری قورئان، ئەم پرسیارە کراوە. ئەوەتا قورئان خۆی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ( وقال الذين كفروا لولا نزل عليه القرآن جملة واحدة كذلك لنثبت به فؤادك ورتلناه ترتيلا)[2]. واتە: *ئەوانەی کە کافرو*

---

[1] سەیرێکی (الإتقان) بکە بەرگی ١/٥٤.
[2] سورة الفرقان/٣٢.

*بۆ پەروابوون دەمانوت بۆ قورئانی بەیەک پارچە بۆ نەهاتووەتە خوارێ؟ یا یەک پارچە بوایە بچڕبچڕ نەهاتایە!! لەوەلامیاندا خوا دەفەرموێ: بۆ ئەوەی دڵ و دەروونی پێ جێگیر بکەین و بەشێنەیی یەک لە دوای یەک بۆمان ناردی تا بە ئاسانی لێی تێبگەیت و لەبەری بکەیت.*[3]

... هەروەک لەوەپێش باسمان کرد هاتنەخوارەوەی قورئان نزیکەی ۲۳ ساڵی خایاند، جاری وا هەبووە ئایەتێک یا چەند ئایەتێک هاتووەتە خوارێ جاری وایش هەبووە دە ئایەت و بگرە سورەتێکیش هاتوەتە خوارێ بۆ نموونە سورەتی «والمرسلات» بەیەکجار هاتووەتە خوارێ هەروەک ابن عمر بۆمان دەگێڕێتەوە[4].

**ئەمەیش بەهۆی پێویست بوونی چەندەها حیکمەتی گەورەوە تیا رەچاو دەکرێت:**

**یەکەم:** تا پێغەمبەر ﷺ خۆی بۆی لەبەرکردنو بۆی رەوان بکرێت چونکە نەخوێندەوار بوو قورئانیش بەنووسراوەیی نەهاتووەتە خوارێ.

**دووەم:** ئەحکام و دەستووری یاسایەکی زۆری تێدایە ئەگەر بەیەک پارچەیی پێکەوە بهاتایە خەڵکەکە نەیاندەتوانی ئەنجامی بدەن و بەجێی بهێنن..

**سێیەم:** وەڵامی چەندەها پرسیاری تێدایە تا پرسیارەکان نەهێتە پێشەوە لەحاڵی بوونیان زەحمەتە، بەڵکو نەگونجاوە..

**چوارەم:** دەرمانی دەردە کۆن و کوشندەکان بوو، پلە بەپلە لەرەوشتی نزمەوە ئەو خەڵکەی گواستەوە بۆ جوانترین و بەرزترین رەوشت، ئەو شتانەی خوویان پێوە گرتبوو، ببوو بەپارچەیەک لە ژیانی کۆمەڵایەتیان بەو هەنگاو بە هەنگاو نەبوایە چارەسەری نەدەکراو بۆیان واز لێنەدەهێنرا.

**پێنجەم:** قورسایی و سەنگینی گەیاندنی پەیامی خوا کەوتبووە ئەستۆی پێغەمبەر ﷺ لەناو خەڵکێکی سەرکەشی ئەزانی دڵڕەقدا

---

[3] نظرات في القرآن ، محمد الغزالي/ ۲۰.
[4] الإتقان في علوم القرآن ۱ / ۳۸.

که تا چەناگەیان لە نەفامییدا چەقیبوون پێغەمبەر ﷺ بە درۆزنیان دادەنا کەچی ئەوە بەدەست پاک و ڕاست گۆ لەناویانا بەناوبانگ بوو، لەوە ناخۆشتر ئەوە نیشان ڕاستگۆیی بە درۆزن بدرێتە قەڵەم، بێتاوان بێ بە تاوانکار ناوی ببەن... زیاد لەوە شوێن کەوتەیەکی کەمی هەبوو دژایەتییەکی زۆری بێ‌چانی دەکرێت، ئازاری دڵی دەدرا، ئەویش خەفەتی بۆ نەفامی و تێنەگەیشتنی ئەوان دەخواردەوە، قورئانیش وەک مەڵهەمو دڵخۆشکەر وابوو بۆ پێغەمبەر ﷺ و ئەمی خەمی لە دڵە پاکەکەیدا نەدەهێشت..

خۆ ئەگەر ئادەمیزاد لەکاتی پەرێشاو لە جێگای سەختەکەیدا بگەنە فریای قسەی پڕ بە پێستی ئەو شوێنەی بۆ بێن، دەزانن ئەو قسەیە چەند کاریگەرو بەتین و ئەوژم دەبێت؟ لەڕاستیدا وەک ئاوێکی شیرین وایە بۆ دەروونێکی بەگەرما هەڵپڕژاو...

**شەشەم**، قورئان داوای مەیدان داری لە هەموو دەم ئەهل قەزان و ڕەوانبێژانی عەرەب دەکردو دەیگوت: ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەوە نییە کە قورئان پەیامی خوایێت ئەمە عەرزو ئەوە گەز؟ وەرن وێنەی قورئان دابنێن!!!؟ لەگەڵ ئەوەشدا قورئان هەر لەو پیت (حرف)انە پێک هاتووە، کە خۆتان قسەی پێدەکەن، داوای ئەم مەیدان داریەش لە مەککەدا هاتە خوارەوە؟ لەم ماوەیەشدا لەنێوان کۆمەڵی ئایەت و کۆمەڵێکی‌تردا ماوەیەکی وای پێدەچوو کە بەس بێت بۆ خۆئامادەکردنیان و هاتنیان بۆ ئەو مەیدانە لەگەڵ ئەوەدا کە بەشی زۆری سوورەتە مەککەییەکان بچووک بوون و ئەو ماوەیەشیان بۆ دەرخسا تا خۆیانی تیا ئامادەبکەن، ئەمان توانی لەو مەیدانەدا ئەو (گۆ)یە ببەنەوە.. خاڵی شەشەم بریتییە لەوە کە: هاتنەخوارەوەی قورئان بە پچڕ پچڕی ئەو حیکمەتەی تیابوو کە ماوە بدات بەمەیدانگیرەکان خۆیان ئامادەبکەن بۆ مەیدان داری کردنی قورئان لەگەڵ ئەوەشدا تێک شکان و نەیان توانی، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە قورئان نامەو پەیامی خوایە..

**حەوتەم**، بەشی زۆری خەڵکەکە نەخوێندەوار بوون ئەگەر بەیەک پارچەیی بهاتایەتە خوارێ، بۆیان لەبەرنەدەکرا، بەڵام کاتێ کۆمەڵە ئایەتێک لە ڕووداوێکی دیاریکراودا، یا بەهۆیەکی

دیاریکراوەوە دێتەخوارێ لەمیشکیاندا نەخش دەبەستێ و بەئاسانی بۆیان لەبەر دەکرێ..

هەشتەم : ئایەتەکانی قورئان پەیوەندییەکی پتەویان هەیە بەو باروو دۆخەی تیایداهاتووەتە خوارێ.. تێگەیشتن لەو باروودۆخە بەشێکە لە تێگەیشتنی ئایەتەکان، جا ئەگەر قورئان یەیەکە پارچەیی بهاتبایە خوارێ، هەرکەس بیویستایە حوکمێکە لەو حوکمە شەرعیانە لەبەرامبەر حاڵەتێکە ، رووداوێکەوە دابنێ تیایا سەرلیسە دەبوو هەرچەندە دەستێکی باڵای هەبوایە لە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەدا جا لەبەرئەوە ستەمێکی گەورەیە ئەوەی ئاگاداری باروودۆخی هاتنەخوارەوەی قورئان نەبێ و دەست بداتە تەفسیر کردنی چونکە هۆی هاتنەخوارەوە -سبب النزول- و کاتی هاتنەخوارەوە دوو بەشی سەرەکین واتاو مەبەستی قورئانەکە روون دەکەنەوە لەبەرئەوە پشت گوێخستنیان تاوانێکی گەورەیە...

خاڵی هەشتەم ئەوە دەگەیەنێ بەش بەش هاتنەخوارەوەی قورئان ئەو سوودەیشی هەبووە حوکمە شەرعییەکانی بەپاشی حاڵی بیین..

... جا ئەمانەی باسکران کەمێکە بوون لەو حیکمەتانەی کە ئێمە هەستی پێدەکەین و لەوانەیە لەداهاتوودا حیکمەتی زۆر زیاتریشمان بۆ دەربکەوێت..

## یەکەمین ئایەت و دوایین ئایەتی کە هاتبێتە خوار

... وتمان سەرەتای هاتنەخوارەوەی قورئان لەئەشکەوتی (حراء)دا دەستی پێکرد و یەکەم ئایەتێک کە هاتە خوارەوە ئایەتەکانی سوورەتی (علق) بوون و ، یەکەم سوورەتێک لەدوای وەستانی (وەحی) هاتبێتە خوارەوە سوورەتی (یا أیها المدثر) بووە و دوایین ئایەتێک لە قورئان هاتبێتە خوار ئەم ئایەتەیە (واتقوا یوما ترجعون فیه إلی الله) *واتە بترسن لە رۆژێک کە تیایدا دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا*.. ئەم ئایەتەش ئایەتی (٢٨١)ی سوورەتی (البقرة)یە..

.. بەلام ئایەتی (اليوم اكملت لكم دينكم واتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الإسلام دينا)[1] هەرچەندە هەندێکیان وایە دوایین ئایەتە، چونکە تەواوبوونی ئاین بە تەواوبوونی حەرام و حەلال و ئەحکامەکان دەبێت و خوایش دەفەرموێ: ( ئەمڕۆ ئاینەکەم بۆ تەواوکردن و، نیعمەتی خۆم تەواوکرد بەسەرتانا و بە ئیسلام رازی بووم بیبێتە دینتان).کەوابوو ئەمە دوایین ئایەتە .. بەلام زانایان ئەوانەیان داوەتەوە کە ئەو بۆچوونەیان بووە وتوویانە (ئەم ئایەتە لە عەرەفەو لە سالی حەجی مالئاوایدا هاتۆتەخوارێ) پاش ئەو چەندەها ئایەتی تر هاتوون وەکو ئایەتەکانی باسی (ربا) قەرز (دین)و لەبەرئەوە دوایین ئایەت نییە.

.. بەلام ئەگەر دەلێن تەواوبوونی ئاین بە تەواوبوونی ئەحکام دەبێ دەلێین (ابن عباس) ﷺ دەفەرموێ: موسلمانەکان و بت پەرستەکان پێکەوە حەجیان دەکرد و تێکەل دەبوون، بەلام کە ئایەتی (براءة) هاتە خوارەوە بت پەرستەکان دوورکەوتنەوە لە (کعبة)و نەدەهاتنە ناو موسلمانانەوەو هاوبەشیان نەدەکرد. ئەمەش تەواوی نیعمەتی خوابوو کە دەفەرموێ: نیعمەتی خۆمم بەسەردا تەواو کردن)[2]..

[illegible]

- هۆی هاتنەخوارەوە یەو رووداوە دەلێن کە ئایەتەکان هاتوونەتە خوارەوە و باسی ئەو رووداوەیان کردووە، یا رووتیان کردۆتەوە، زۆر لەو یاداشتە تەفسیریانە دەبێن کە لە پێشەوە پیشاندانی ئەم رووداوە بەکاردەهێنرێن...

- ئەمەش رانەگەیەنێ هەرچی ئایەتی قورئان هەیە هۆی هاتنەخوارەوەی هەبێ چونکە هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان سێ جۆر بوون:

---

[1] سورة المائدة ٣.

[2] ئەمەش عەرەبییەکەیەتی: عن ابن عباس قال: كان المشركون والمسلمون يحجون جميعا فلما نزلت (براءة) نفي المشركوا عن البيت، وحج المسلمون لا يشاركهم في البيت الحرام احدا من المشركين لكان ذلك من تمام النعمة واتممت عليكم نعمتي. رواه ابن جرير عن طريق ابي طلحة.

[3] ئەم دەقە لە (الإتقان في علوم القرآن)ی شێخی سیوطی یەوە وەرگیراوە. ١/٢٩.

یەکەمیان، وەڵام بووە بۆ ڕووداوێک و ڕوونی کردۆتەوە..

دووەمیان، وەڵام بووە بۆ پرسیارێک و ئەوی پێویست بێ باسی کردووە...

سێیەمیان، بێ ئەوەی ڕووداوێک ڕوویدات یا پرسیارێک بکرێت خوا ناردویەتیە خوارێ، لەبەرەشدا دەبێ بڵێین ئایەتەکان دەبنە دوو جۆرەوە:

(١) *جۆرێکیان پێویستە هۆی هاتنەخوارەوەی بزانرێ* بۆ گەیشتن بە ناسینی ڕەمای یاسا داناکە (معرفة أصول التشريع) چونکە ناسینی هۆی هاتنەخوارەوە مەبەستی یاسادانانەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، یا حوکمێکی گشتیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە بووە بە تایبەت، یا یەسەرچوونی حوکمێک و کارکردن بە حوکمێکی نوێترمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

(٢) *جۆرێکی تریان پێویست نییە هۆی هاتنەخوارەوەیان بزانین* وەک ئەو ئایەتانەی باسی بەسەرهات و ڕووداوی میللەتانی پێشوومان بۆ دەکەن، چونکە بەشی زۆریان بێ هۆیەکی تایبەت هاتوونە خوارێ..

ئەمەش واناگەیەنێ کە هەموو ئایەتێک باسی ڕووداو بەسەرهاتی کردبێ پێویست نییە هۆی هاتنەخوارەوەی بزانین.. نەء.. چونکە هەندێ بەسەرهات هەیە تا هۆی هاتنەخوارەوەکەی نەزانرێ ئادەمیزاد لێی حاڵی نابێ وەک ئایەتەکانی (ئیفک) و بەسەرهاتی (خضر و موسی) (عليه السلام) هەروەها هەندێک لەبەسەرهاتی پێشینەکان چونکە بۆ پەند و ئامۆژگاری هاتوون پێویست ناکات هۆی هاتنەخوارەوەیان بزانرێت. هەروەها ئەو ئایەتانەی کە باسی هەڕەشەکردن و مژدەدان و ئامۆژگاری و ڕێنموونی پەرستش دەکەن پێویست ناکات هۆی هاتنەخوارەوەیان بزانرێ وەک ئەم ئایەتە (يا أيها الذين آمنوا إذا قمتم إلى الصلاة فاغسلوا وجوهكم وأيديكم إلى المرافق)[1].

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە کاتێ هەستان بۆ نوێژ دەم و چاوتان بشۆن و هەردوو دەستتان تا ئەنیشکتان...

---

[1] سورة المائدة / ٦.

## سوودی زانینی هۆی هاتنەخوارەوە

*زانینی هۆی هاتنەخوارەوە چەند سوودێ*

وشەی حوکمەکە وادەبێ گشتی دەبێ بەڵام بەڵگە هەیە کەمەبەست گشتی نییەو تایبەتە بۆ نموونە ئەم ئایەتە (لا تحسبن الذين يفرحون بما أوتوا ويحبون أن يحمدوا بما لم يفعلوا فلا تحسبنهم بمفازة من العذاب ولهم عذاب أليم)[1].

*واتە: وانەزانن ئەوانەی شادمان دەبن بە سەرگەردان خەڵکی پێیان وایە خۆشە سوپاس بکرێن لەسەر کارێک کە ئەنجامیان نەداوە وا گومانیان پێنەبێت کە لە سزاو ئازار، رزگار بووە، نەء.. وا نەزانی ئەوانە سزای بەئێشیان بۆ هەیە..*

مەروانی کوڕی حەکەم کاتێ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە دەیگوت ئەگەر هەرکەس شادمان بێت بەوەی پێدراوەو حەزیکات سوپاسیشی بکرێت لەسەر شتێ کە نەیکردووەو سزا بدرێ دەبێ هەموان سزا بدرێن. ئەمە بۆچوونی مەروان بوو، تا (ابن عباس) خوایان لێ رازی بێت- فەرمووی ئەم ئایەتە لەبارەی شوێن کەوتەی نامە ئاسمانیەکانەوە هاتەخوارێ، کاتێ داوای شتێکی لێکردن و ئەوانیش شاردیانەوەو شتێکی تریان پێ گوت، وایان پیشان دا کە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ داوای کردووە پێیان گوتەو چێگەی خۆیەتی سوپاسیان بکرێت..

لەم ئایەتەدا وشەی (ئەوانەی) گشتییە، ئەگەر هۆی هاتنەخوارەوەکە نەزانرایە.. گشت کەسێکی تریش وەکو (مەروانی کوڕی حەکەم) لێی حاڵی دەبوون، بەڵام زانینی هۆی هاتنەخوارەوە ئەو گرێیەندەی نەهێشتۆتەوە[2].

## [illegible]

تەنها رێگایەکە بۆ ناسین و زانینی هۆی هاتنەخوارەوە هەواڵی راستە.

---

1

2 ئەم باسە لە کتێبی (الإتقان في علوم القرآن)ی شێخی سیوطی وەرگیراوە بەرگی ١/ ٣١-٣٢ هەرکەس زیادەشارەزایی دەوێت با سەرێکە لەوێ بدات چونکەلێرەدا باسەکەمان لەو بارەوە بەدرێژی نییە.

ئەگەر هاوەڵ (صحابە)یەک هۆی هاتنەخوارەوەی بۆ باس کردبین ئەوا ئیتر وەرەدەگیرێ هەرچەند لە ڕێگەیەکی تریشەوە باس نەکرابێ و پاڵپشتی نەبێ و، حوکمی (مرفوع)[3]ی هەیە چونکە زۆر دوورە بگرە مەحاڵیشە کە هاوەڵێک لەخۆیەوە شتێکی وا بڵێت ئەم کارە پەرتی دەگوترێت (ھەواڵ- خبر) وەی هەواڵیش یا لە ڕێگەی بیستن وگێڕانەوەوە، وەیان لە ڕێگەی بیستن و بینینەوە دەبێت. بەڵام ئەگەر هەواڵەکە (مەرفوع) نەبوو بەڵکو (مرسل)[4] بوو واتە هاوەڵ (صحابە)ی تیا نەبوو، واتە ئەوانەی گێڕاویانەتەوە گەیشتە (تابعين) مەگەر لەڕێگەیەکی ترەوە (مرسل)ێکی تر پشت گیری بکات، ئەو (تابیع)ەی دەیگێڕێتەوە یەکێک بێت لە پێشەواپانی تەفسیر و لەلای هاوەڵەکان دەرسی خوێندبێ وەکو ئەم تابیعە ناودارانە ( مجاهد، عكرمة، سعيد ابن المسيب، الحسن البصري، عطاء، قتادة، الضحاك،...) ڕیوایەتی ئەمانە یا (مرسل)یشی بێت بەهێزە بۆ پاڵپشتی مەسەلی تر چونکە پارێزگاریان لەلایەکەوە و لەلایەکی ترەوە لە خزمەت هاوەڵەکانا ژیاون کەتەمەنی ئەوە دەگەیەنێ لەوانیان وەرگرتووە.

## بەچەند جۆرێک هۆی هاتنەخوارەوە باس دەکرێت

ئەو دەستەواژانەی هۆی هاتنەخوارەوەیان پێ دەردەبڕێت لێک جیاوازن، واتەبێ وشەی هۆی تیا بەکاردەهێنرێت و دەگوترێت هۆی هاتنەخوارەوەی فلانە ئایەت ئەوەبوو.. وا دەبێت باسی ڕووداوێک دەکرێت و دەگوترێت ئینجا ئایەتی فلان هاتە خوارەوە.. وەک ئەوە باسی ڕووداوی (ظهار)[5]ەکەی (ئەوسی کوری صامت)

---

[3] مرفوع: ئەوە فەرموودەیەیە کەهاوەڵێک کارێکی یا فەرموودەیەکی یا رەوشتێکی پێغەمبەریان ﷺ بۆ بگێڕێتەوە.

[4] (موڕسەل) فەرموودەی (مرسل) ئەو فەرموودەیەیە کەلە گێڕانەوەکەیا (صحابە)ی تیانەبێت و (تابعی)یەکی گەورە گێڕابێتیەوە. دەبێ ئەوە بزانین کە فەرموودەی (مرسل) لەلای جمهوری زانایانی فەرموودە بە (لاواز) (ضعیف) دەدرێتە قەڵەم.

[5] سەیرێکی سەرەتای تەفسیری (نامی)و تەفسیری (خال) بکە لە جزءی (قد سمع الله)دا جزءی ٢٨ تا بەتەواوی لە واتای (ظهار) ئاگادار بیت.

دەکەن و (خەولە)ی خێزانی چەند جارێک هاتووچۆی کردو (مجادلە)ی لەگەڵ پێغەمبەردا کرد. ئینجا خوا ئەو ئایەتانەی سەرەتای سورەتی مجادلەی نارده خوارەوە..

یا وادەبێ باسی ئەوە دەکەن کە پرسیارێک لە پێغەمبەر ﷺ کراوە ئەویش بەو ئایەتانە وەڵامی داونەتەوە کە بە وەحی بۆی هاتوون.

## جیاوازی نێوان قورئانی پیرۆز و فەرموودەی قودسی

*لەم بەراوردەدا جیاوازی نێوان قورئان و فەرموودەی (قودسی)مان بۆ دەردەکەوێت:*

١- قورئان موعجیزەیە، بەڵام فەرموودەی قودسی وانییە.

٢- لە نوێژدا (فاتحة) کە قورئانە دەخوێنرێت بەڵام فەرموودەی قودسی لەجیاتی (فاتحة) دروست نییە بخوێنرێت.

٣- ئەوەی ئینکاری قورئان بکات پێی کافر دەبێت بەڵام کەسێک ئینکاری فەرموودەی قودسی بکات پێی کافر نابێت بەڵکو پێی فاسق دەبێت.

٤- قورئان وشەو واتاکەی (لفظ و معنی) لەلایەن خواوەیە بەڵام فەرموودەی قودسی تەنیا واتاکەی لەلایەن خواوەیە، دەنا وشەو دارشتنی لەلایەن پێغەمبەر ﷺ ەوەیە.

٥- ریوایەت کردن و گێڕانەوەی قورئان بە واتا (معنی) دروست نییە بەمەرجێ ناوی بنێ قورئان. دەبێ وشەکانی خۆی باس بکرێت. بەڵام لە فەرموودەی قودسیدا دروستە باس کردن و گێڕانەوەی واتاکەی و بڵێیت: ئەمە فەرموودەی قودسییە، هەروەکە گوتمان فەرموودەی قودسی دروستە وشەکانی خۆی باس نەکرێت و مەعناکەی باس بکرێت.

٦- ئەوەی خۆشۆردنی لەسەر بێت واتە (المحدث یمس بیت) دروست نییە دەست بدات لە قورئانەوە هەڵیبگرێ و بیخوێنێتەوە، بەڵام لە فەرموودەی قودسیدا دروستە.

٧- لای ئیمام ئەحمەدی کوری حەنبەل (رەحمەتی خوای لێبێت) فرۆشتنی قورئان دروست نییە، بەڵام لای پێشەواکانی تر باش نییە

ئەگینا دروستە، بەڵام لەلای هەر چوار مەزهەب قرتاندنی فەرموودەی قودسی دروستە.
٨- قورئانی خوا بەڵێنی پاراستنی داوە بەڵام فەرموودەی قودسی وا نییە.
٩- خوێندنەوەی قورئان خێرو ئەوەی پیتێ (حرف) لە قورئان بخوێنێتەوە خوا دە چاکەی بۆ دەنووسێ، بەڵام فەرموودەی قودسی وا نییە.[1]
١٠- لە فەرموودەی قودسیدا دەگوترێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی خوا فەرموویەتی[2]، یان پێغەمبەر ﷺ لە خواوە دەیگێڕێتەوە، یا پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کردین کە ئەویش خوا بۆی باس کردووە.. هتد.

بەڵام قورئان ئەوەی تیا نییە بۆ نموونە بەکەم دەوترێ: خوا فەرمووی: (إن الأبرار لفي نعيم وإن الفجار لفي جحيم)[3]. واتە: بێگومان *پیاوچاکان و چاکەخوازان لە نازو نیعمەتی بەهەشتدان و کافران و بەدڕەوشتانیش لە ناو ئازارو ئاگری دۆزەخدان.*



١) فەرمووەدی قودسی واتە (معنی)کەی لەلایەن خواوەیە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بە داڕشتنی خۆی دەرەبڕێت، بەم پێیە کاتێ کە دەگوترێت فەرموودەی قودسی فەرموودەی خوایە، مەبەست ناوەڕۆک و مەعناکەیەتی دەنا وشەکان و شێوەی داڕشتنەکەی

[1] ئەم تۆ خاڵەی جیاوازییە لە کتێبی (الأحاديث القدسية) للإمام النووي للشيخ والشيخ مصطفى عاشور لاپەڕە (١٦-١٧) وەرگیراوە.
[2] وەکو ئەم فەرموودەیە (عن أنس رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: قال الله تعالى: (أعددت لعبادي الصالحين ما لا عين رأت ولا أذن سمعت ولا خطر على قلب بشر) رواه البخاري ومسلم.
واتە: ئەنەس -خوا لێی رازی بێت- دەفەرمێ: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو خوای گەورە فەرموویەتی: شتی وام بۆ عەبدە صالحەکانم ئامادەکردووە کە چاو نەیدیبێ و بەگوێ نەیبیستبێ و نەهاتبێ بە دڵی هیچ کەسێکدا.
[3] سورة الإنفطار / ١٣-١٤.

لەلایەن پێغەمبەر ﷺ ئەو جیاوازییەی هەیە کە ئاگوتری خوا فەرموویەتی، یا فەرمودەی خوایە، بەڵکو بۆ نموونە دەگوترێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: *(موسڵمان کاتێ گەیشت بە برا موسڵمانەکەی و سڵاوی لێکردو دەستی گرت و تەوقەی لەگەڵدا کرد گوناهیان لێ دەوەرێ وەک چۆن دار لە پاییزدا گەڵاکەی دەوەرێ)*[1].

٢) لێرەدا نە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ئەمە فەرموودەی خودایە وە نە ئەو کەسەش کە فەرموودەکە دەگێڕێتەوە. بەڵام لە فەرموودەی قودسیدا پێغەمبەر ﷺ بە ڕاشکاوی -صراحة- دەفەرموێ: خوا فەرموویەتی: واتە لێمان روونە کە واتاو ناوەڕۆکی ئەو فەرموودەیە لەلایەن خوداوەیە. بەڵام لەفەرموودەی ئاساییدا ئەو ڕاشکاوییە نییە کە واتاو ناوەڕۆکە لەلایەن خواوە بێت.

لەوانەیە کەسێ بپرسێت: ئەی ئەوە نییە قورئان خۆی دەفەرموێت: (وما ينطق عن الهوى إن هو إلا وحي ﷺحى)[2] واتە: بە *ئارەزووکاری قسەکانت ئەوەی ئەو دەیگەیەنێت هیچی تر نییە جگە لە وەحییەک کە بۆی نێرراوە.*

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئاینەوە فەرموویەتی ئەوە وەحی سرووش بووە بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە کاروباری دنیاوە بووبێ و پەیوەستی ئاینی تێدا نەبووبێت ئەوە وەحی نەبووە بەڵکو وەک ئادەمیزادێکە ئاخاوتووە و قسەی کردووە، بۆ نموونە: لەجەنگی بەدری گەورەدا پێغەمبەرو موسڵمانەکان لەم دیوی بەدرەوە بەلای مەدینەوە بووبێ و هەڵیان دابوو خاکێکی وشک و رەق و دوور لە ئاو بوو...

لێرەدا حوبابی کوڕی المنذری مەدینەیی کە شارەزای شوێن و جێگاکە بوو هات و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەم شوێنە بەفەرمانی خوا تیا دابەزیویت یا (را)و (جەنگ)و (فێڵ)ە؟ فەرمووی بەڵێ (را)ی خۆمە و جەنگ و فێڵە: گوتی دەی کەوایە

---

[1] عن حذيفة عن النبي ﷺ قال: إن المؤمن إذا لقي المؤمن فسلم عليه وأخذ بيده فصافحه تناثرت خطاياهما كما يتناثر ورق الشجر) رواه الطبراني.
[2] سورەتی النجم / ٣-٤.

ئەم شوێنە باش نییە. بفەرموو با بڕۆین ■ دەچینە سەر ئاوەکەو دەکەوینە خاوەندی ئاوەکەو قورمیشیەکانەوە، من دەزانم ئاوەکە زۆرەو بیرو حەوزی خۆمانی لێ پڕدەکەین ئەوان بەبێ ئاو پەکیان دەکەوێ.

پێغەمبەر ■ فەرمووی (را)کەت زۆر جوانەو فەرمانیدا چوونە سەر ئاوەکە)[٢].

دەی لەم ڕووداوەدا ئاشکرائین بڵێین دابەزینی پێغەمبەر ﷺ لەشوێنی یەکەمدا وەحی بووە هەروەک پێغەمبەر ﷺ فەرمووی نەخێر وەحی نییە، بەڵکو وەکو ئادەمیزادێکە ڕای تایبەتی خۆی بووە. دەنا بەگوێی حوبابی نەدەکردو ئەمیان دەگوێزایەوە.. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە پێغەمبەر ﷺ هەموو قسەیەکی وەحی نەبووە. وەحی تایبەتی بووە بە کاروباری دینەوە.

[illegible]

**باسی چاوپێکەوتنی پێغەمبەر ﷺ لەپێش پێغەمبەرێتیدا بە (بحیرا) ■ راهیب و ■ نەسەرمانی دابەزینی (وەحی)دا بە وەرەقەی کوڕی ■ نەوفەل**

ئەو خۆرهەڵاتناسانەی کە ئاشنایان لە قورئان داوە ژمارەیان کەم نییەو زۆرن، وەکو: نیۆلدیز، دۆرمنگام، ئەرفەنج، بروکلمان، گوستاف، گولدتسیر، فیلیب حەتتی، ولیام میوز، ... هتد.. بەڵام دەبێ ئەوەمان لەیاد نەچێ کە ئەو خۆرهەڵاتناسانە چەند داخ لەدڵێن بەرامبەر بە ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام ■ وە چۆن هەزارەها درۆو دەلەسەر بوختان دروست دەکەن تا ئیسلامی پێ لەکەدارو ناشیرین بکەن و لەپێش چاو لاوازانیدا لەکەداری بکەن.. لەوانیە بڵێیت: ئەوان لێکۆڵینەوەکانیان بێلایەنانەیە، زۆریان کە باوەڕیان

---

[٢] وەرگیراوە لە ژیانی پێغەمبەری مەزن ﷺ بەرگی یەکەم لا ٢٩٧. چاپی یەکەم.

بە ئیسلام نیە، بە بالای ئیسلاما هەڵیانداوە وەکو مرۆڤێکی ئاگلێرێو هەستێ.. بەڵام ئەگەر بەوردی سەرنج بدەین دەبینین ئەمانە لەسەر بەرنامەو پیلانێکی داڕێژراو کاردەکەن.. بۆ نموونە: ئەوان لەبارەی پێغەمبەری ئیسلامەوە ﷺ هەزار کتێب دەنووسن، [illegible]ر کتێبێکی با سەد لاپەڕە بێ، ئەوان دەهاتەوێ لە ئەوەدەو تۆ لاپەڕەیا، چاکەی پێغەمبەری ئیسلام باس بکەن، بەڵام ژەهرەکەیان دەکەنە لاپەڕەیەکەوە، تەنها لاپەڕەیەک، بەم بۆنەوە کە بەچاکی باسی پێغەمبەریان کرد، نووسەرەکانیان لای موسڵمانان خۆشەویست دەبن، وا تێدەگەن کە نووسەری ئەم کتێبانە نووسەرێکی مەوزوعی بێلایەنن و، تەنها بە شوێن راستیدا دەگەڕێن! لە ئەنجاما ئەم کارەش دەبێتە هۆی ئەوە خوێنەر ژەهرەکە بخواتەوەو هەستی پێ نەکات.. بەرای خۆم ئەوەی ژەهر لەناو پیاڵەیەک هەنگوینا دیاری نادات، بەڵام گەدە (معدة) ئێشک دەدات..

ئەگەر هەموو نووسەرەکان هەریەکە لەلایەکەوە تانەیەکیان دا لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ، ئەوا کۆی هەموو نووسراوەکانیان دەتوانێ رواڵەتی ئیسلام ناشیرین بکات و رەوشتی پێغەمبەرەکەی ﷺ لەکەدار بکات..

بەڵێ ئەمە پێشەی ئەو خۆرهەڵات ناسانەیە.. ئەنجا با بچینەوە سەر قسەکانیان لەبارەی قورئانەوە.. ئێرڤایز دەڵێ: *(محمد لە گەشتەکانیا بۆ میسرو شام قورئانی فێربووە لە لەشکەی ئەڵەکانەوە وەری گرتووە).*

بەڵام ئەگەر ئێمە سەرێک لەکتێبەکانی مێژوو بدەین و کۆن و نوێی هەموویان بپشکنین، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە ئەم خۆرهەڵات ناسە لە مێژوو بێ ئاگایە! چونکە محمد ﷺ لە ژیانیا [illegible] پێش پێغەمبەرایەتی و ج پاش پێغەمبەرایەتی نەڕۆیشتووە بۆ میسر..

قسەی ئەم خۆرهەڵات ناسە تەنها داخ لەدڵییەتی ئەو دەگەیەنێ بێئاگایبوونی لەمێژوو..

هەروەها (دۆرمەنگام) دەڵێ: *(محمد لە گوندی (مەدیەن) لەگەڵ کاروانێکی بازرگانیدا، چاوی کەوتووە بە هەندێ لە قەشەکان و لەوانەوە فێری قورئان بووە..)* .

خۆ ئەگەر ئەم خۆرهەڵاتناسە زانایە، سەرنجێکی نەخشەی وڵاتانی عەرەبی بدایە، هەرگیز ئەم هەڵە گەورەی تووش نەدەبوو! چونکە گوندی (مەدیەن) لەسینادایەو، ڕێگەی بازرگانی کاروانی مەککە بۆ شامی پیسەرەوە نییە، چونکە کاروانی حیجاز ناچێتەوە سینا، کە پێیەوێ بڕوات بۆ شام..

ئایا خۆرهەڵاتناسێکی وەها شارەزای شەرمەزاری دەربدایە لەوە باشتر نەبوو کە بەنەزانین ژیانی محمد ﷺ بنووسێ؟

بەڵێ وە نەبێ پێغەمبەر هەرگیز چاوی بەقەشەی قەڵەکان نەکەوتبێ، هیچ کەسێکی لەوان نەدیتبێ.. نەء.. بەڵکو چاوی بە دوو قەڵە کەوتووە کە لەئاییەنی عیسا شارەزابوون، زۆربەی کتێبە مێژوویەکانیش ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕنەوە..

قەڵەی یەکەم:

ناوبانگی بە (بوحەیرا) دەرکردوو بۆ ئەم مەبەستە سەیرێکی ئەم کتێبانەی خوارەوە بکە.

١- سيرة النبي، ابن هشام .. ج١ ص١٩٤-١٩٧ دار الفكر.
٢- الطبقات الكبرى، لابن سعد .. ج١ ص٩٩-١٠٠.
٣- دلائل النبوة، أبي نعيم الأصفهاني، ج١ ص٥٢.
٤- السيرة، محمد الغزالي ص٦٨ دار الكتب الحديثة القاهرة.
٥- فقه السيرة/ د.محمد سعيد رمضان البوطي، ص٥٥ دار الفكر، بيروت.
٦- نبوة محمد من الشك إلى اليقين د.فاضل السامرائي/ ص٤٧-٤٩، مكتبة القدس-بغداد.
٧- تاريخ الطبري، الطبر / ج٢ ص٢٨٧.
٨- ژیانی پێغەمبەری مەزن، عبدالعزیز پارەزانی، چاپخانەی کامەرانی ج١ لاپەڕە ٨٨-٩٠، ١٩٧٤.

ئەمەش دەقی نووسراوەکەی (سیرەتی نەبی و هیشامە) (ئەبو تالیب لەگەڵ کاروانێکدا خۆی ئامادەکرد بۆشام بچێ، لەکاتی ڕێکەوتنی کاروانەکەدا پێغەمبەر ﷺ زۆر حەزی دەکرد لەگەڵیا بڕوات، ئەبوتالیبیش دڵی نەرم بوو، بۆیە گوتی: وەڵلاهی لەگەڵ خۆما دەیبەم، نابێ هەرگیز لێم جیا ببێتەوەو لێی جیا ببمەوە..

لەگەڵ خۆیا بردی.. کاتێ کاروانەکە گەیشتە (بوصرا) لە وڵاتی شام -لە کەژی حۆران و لە نزیک ئەو شارۆچکەیەوە- راهیبێک هەبوو کە لەنەشکەوتێکی ئەو شاخەدا گۆشەگیربوو بۆ خواپەرستی پێیان دەگوت بوحەیرا، شارەزابوو لە زانیارییەکانی ئاینی عیسا گوایا ئەو ئەشکەوتەش هەر لە کۆنەوە راهیبی تیابووەو پشت بەپشت و بەرەبەبەرە ئەو زانیاریانەیان گەیاندووە بەیەکتر..

ئەو ساڵە لایان دایە لای بوحەیرا، لەوەپێش چەندەها جار بە نزیک ئەو شوێنەدا تێپەڕیبوون بوحەیرا نە قسەی لەگەڵ کردبوون نە ڕۆیشتبوو بۆ لایان، تا ئەو ساڵە.. کە لەنزیک و پەرستگا (صومعە) کەی ئەوەوە باریان خست خواردنێکی زۆری بۆ دروست کردن، بە هۆی ئەوەوە -گوایا- لە پەرستگاکەی خۆیەوە پێغەمبەری دیوە، کە پەڵە هەورێک بووە بە سێبەر بەسەر سەریەوە لەناو کاروانەکەدا ئەنجا هاتوون لەژێر درەختێکدا خستوویانە کە لە نزیک پەرستگاکەی بوحەیراوە بووە کاتێ کە لەژێر درەختەکەدا خستوویانە لق و پۆپی درەختەکە هاتۆتەوە یەک و سێبەرێکی چڕوپڕی بەسەرەوە کردووە، بوحەیرا لە هەیوانی خانەکەی خۆیەوە کەنەمەی دیوە هاتۆتە خوارەوە، دەعوەتی کردوون و نانی بۆ دروست کردوون و داوای لێکردوون کە هەموو میوان داریان بکات و گەورەو بچووک و ئاغاو نۆکەریان ئامادەبن بۆ ئەو نان خواردنە..

کاتێ ڕۆیشتنە سەر خوانی بوحەیرا پیاوێک لەکاروانیەکان گوتی: ئەی بوحەیرا وەڵاهی ئەمڕۆ کارێکت هەیە! چونکە ئێمە زۆرجار بەلای تۆدا ڕۆیشتووین و ئەم کارەت نەدەکرد بەرامبەر بە ئێمە ئەمڕۆ چیت بە دەستەوەیە؟

بوحەیرا پێی گوت راست دەکەیت، هەروابووە کە تۆ دەڵێیت بەڵام ئێوە میوانن و منیش پێم خۆشە ڕێزتان بگرم و نانتان بۆ دروست بکەم و هەمووتان لێی بخۆن..

هەموویان ڕۆیشتن تەنها پێغەمبەر [redacted] نەبێ لەناویانا بەجێما، لەبەر تەمەنی بچووکی بەلای بنەو بارگەکەوە جێیان هێشت، کە لەحەڵکەکە ورد بووەوە ئەو سیفەتانەی کە ئەو دەیزانی

*لەوانا نەبوو، ئەنجا گوتی: کۆمەڵی قورەیش لەناو ئێوەدا کەس ماوە ئەحاڵتیبێ بۆ ئەم خولاردنەو بمجێ مابێ؟*

گوتیان ئەوی شیاوی هاتن بێ بەجێنەماوە، تەنها منداڵێکە نەبێ لەبەری ئەوەی کەتەمەنی زۆر بچوکە بەلای کەل و پەل و شتومەکەکانەوە جێماوە.. ئەویش گوتی ئێشتی وا مەکەن، بانگی کەن با ئامادەبێ لەگەڵ ئێوە لەم نانە بخوات، پیاوێک لە قورەیشیەکان کە لەگەڵ خەڵکەکە بوو گوتی: بە (لات) و (عـوززا) قەسەم شورەییە بۆ ئێمە تەنها کوڕی (عبداڵله)ی کوڕی (عبدالمطلب) لەناو ئێمەدا لەم نانە نەخوات و دوابکەوێ، ئەنجا هەڵساو رۆیشت بەوشێنیار هێنای بۆ ناو خەڵکەکە.

کاتێ کە بوحەیرا بینی زۆر سەرنجی داو لێی وورد دەبووەوە، وەک ئەوە بیەوێ شتێک بەلەشیەوە ببینێ.. هەندێ لەو سیفەتانەی کە دەیزانی لەوا هەبوو.. کە خەڵکەکە لەنان خواردن بوونەوە بڵاوەیان لێکرد، بوحەیرا رۆیشتە لای و گوتی: ئەی لاو تۆبیت و (لات) و (عـوززا) هەر پرسیارێکت لێ دەکەم بەراستی وەڵامم بدەرەوە -بوحەیرا بۆیە وای گـوت: چونکـە دەیبیست خەڵکەکە سوێندیان بەو دوانە دەخوارد- گوایا پێغەمبەر ■ لەوەڵاما فەرمووبێتی: بەو دووانە سوێندم مەدە، بۆ هیچ شتێک: چونکە قەسەم بە خوا هیچ شتێک نییە ئەوەندە رقم بێ لێی کە رقمە لەو دووانە، بوحەیرا گوتی: سوێندت دەدەم بە خوا هەرچیت لێدەپرسم راست وەڵامم بدەرەوە..

پێیگوت: چیت دەوێ بپرسە، دەستی کرد بە پرسیارکردنی حـاڵی لـەبارەی: خەویـەوە، شـێوەیەوە، ئیـش و کارێـەوە.. پێغەمبەریش وەڵامی دایەوە.. ئـەم وەڵامانـەی پێغەمبـەر ﷺ یەکسـان بوون لەگەڵ ئەو سیفەتانەی کە ئەم دەیزانین ئـەنجا تەماشای پشـتی کرد مۆری پێغەمبەرایەتی بەدی کرد لـەنێوان هەردوو شانیدا، بەو شێوەی کە ئەم دەیزانی .. کە لە پرسیارەکانی بووەوە رووی کردە ئەبوتالیبی مامی پێغەمبەرو پێی گـوت: ئـەم کوڕە چیتە؟

گوتی : کوڕمە.. بوحەیرا گوتی: ئەمە کوڕی تۆ نیەو نابێ ئەم کوڕە باوکی لە ژیانا بێ. ئەبوتالیب گوتی: برازامە، گوتی باوکی چ کارە بوو؟

گوتی: ئەم کوڕە لە سکی دایکیدا بوو کە باوکی مرد؟

گوتی: راست دەکەیت، برازاکەت بیبەرەوە بۆ وڵاتی خۆی بیپارێزە لە جوولەکە (یەهود) وللاهی ئەگەر بیبینن و وەک من دەیناسن بیناسن تووشی رۆژگارێکی رەش و ناهەمواری دەکەن ئەم برازایەی تۆ داهاتوویەکی رووناکی دەبێ؛ پلەو پایەی بەرز دەبێتەوە، زوو بیبەرەوە بۆ جێگای خۆی. ئەبو تالیب لەگەڵ لێبوونەوە لەبازرگانییەکەی خێرا هێنایەوە بۆ مەککە.. هەروەک لە پێشەوە باسمان کرد ئەم رووداوە لە زۆربەی کتێبە مێژووییەکاندا باسکراوە..

لێرەدا دەبێ بپرسین : بوحەیرا بۆچ ترسا لەوەی کە جوولەکەکان محمد بکوژن ؟

لەوەڵاما دەڵێم : جوولەکەکان ناوبانگیان دەرکردبوو لە کوشتنی پێغەمبەرەکاندا، ئەوەبوو کە حەزرەتی عیسا [redacted] خوا کردی بە پێغەمبەر جولەکەکان ویستیان بیکوژن، بوحەیراش لەو بۆچوونەوە ترساوە لەکوشتنی محمد [redacted] بەدەستی جولەکەکان..

هەروەها ئەم رووداوە بەڵگەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەوە کە نیشانەکانی پێغەمبەر [redacted] لە تەورات و ئینجیلدا باسکراوە؛ چونکە بەڵگەی تریش لەم بارەوە زۆرە ئەوەبوو کە سەلمانی فارسی هات بۆ نیوەدوورگەی عەرەبی (جزیرة العرب) لەسەر ئەو ناونیشانانە بوو کە قەشەی گاورەکان بۆیان باس کردبوو.

هەروەها لەمەدیتەدا جولەکەکان بەعەرەبەکانیان دەگوت -لە کاتێکدا کارێکی ناڕەوایان بکردایە- بەم زووانە پێغەمبەری ئاخر زەمان پەیدا دەبێت و، ئێمەش پشتگیری دەکەین لەناوتان دەبەین، لەگەڵ ئەوەدا کە خوا محمدی کرد بە پێغەمبەر [redacted] دەستیان کرد بە دوژمنایەتیو پیلان گێڕان بەرامبەر بە خۆیو ئایینەکەی.

بەڵێ، هەموو ئەو کتێبانەی کە دان بەم رووداوەدا دەنێن، دەڵێن: محمد [redacted] تەمەنی لەدەوری دوانزە ساڵیدا بووە.. پاشە

منداڵێکی نەخوێندەوار لەماوەی سەعاتێکدا، یابڵێین چەند ڕۆژێکدا چۆن توانی هەموو قورئان لەبەر بکات؟..

یان چۆن توانی ئەم هەموو یاسا و فەرمان و دەستوورو شەریعەت و بەرنامە فراوانەی ئیسلامی لەکاتێکدا وەرگرێ کە عەرەب نەبێ، زمانی عەرەبیش باش نەزانێ؟

بۆ چی تا بیست و هەشت ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوە تێپەڕ نەبوو دەنگی نەکرد: بۆ لەم ماوە دوورو درێژەدا لەو ڕووداوە هیچی لێ نەبیستراو؟

برەحیرایەکە کە عەرەب نەبوو چۆن توانی بە زمانێکی بێگانە وتارو پەخشانی وا دابنێت کە هەموو ڕەوانبێژی عەرەب دەستەپاچەبن و نەتوانن وێنەی چەند دێڕێکی دابنێن؟

ئەو دوژمنانەی ئیسلام کە بۆ بچووکترین خاڵێک دەگەڕان بیکەن بەبەڵگە بۆ بەدرۆخستنەوەی، بۆ ئەم باسە یان نەهێنا، دنیایان پێ پڕ نەکرد؟

بۆ لەناو ئەو کاروانیانەدا تەنها محمد ﷺ فێری ئەم قورئانە بوو، کەسێکی تر لە هاوەڵەکانی فێر نەبوو؟.. چۆن محمد ﷺ لە تەمەنی دوانزە ساڵیەوە، ئەم قسانەی لەمێشکدا مابێتەوە، تا تەمەنی چل ساڵی هیچی لێ تێک نەچوو؟

کاتێ محمد ﷺ بانگی فەلەکانی کرد بۆ وەرگرتنی ئیسلام و ئیسلامی بۆ باس کردن و قورئانی بۆ خوێندنەوە، بۆ ئەیان گوت: خۆ ئەمە کاڵاو شت و مەکەکەی خۆمانە تۆ بۆت هێناوینەتەوە؟ ئەو ئایەتانەی کەپێچەوانەی فەلەکانە ئەم ئایەتانەن:

ئایەتی (٧٢) لە سوورەتی (المائدة) دەفەرمووێ:

( لقد كفر الذين قالوا إن الله هو المسيح ابن مريم ) .

ئایەتی (٧٣) لە سوورەتی (المائدة) دەفەرمووێ:

( لقد كفر الذين قالوا إن الله ثالث ثلاثة وما من إله إلا إله واحد) .

ئایەتی (١١٦) لە سوورەتی (المائدة) دەفەرمووێ:

( وإذ قال الله ياعيسى ابن مريم ءأنت قلت للناس اتخذوني وأمي إلهين من دون الله ؟ ..).

ئایەتی (١٧١) لە سوورەتی (النساء) دەفەرمووێ:

﴿ إنما المسيح عيسى ابن مريم رسول الله وكلمته ألقاها إلى مريم وروح منه فآمنوا بالله ورسله ولا تقولوا ثلاثة انتهوا خيرا لكم إنما الله إله واحد سبحانه أن يكون له ولد... ﴾.

ئایەتی (٦) لە سوورەتی (الصف) دەفەرمووێ:

﴿ وإذ قال عيسى ابن مريم يا بني إسرائيل إني رسول الله إليكم مصدقا لما بين يدي من التوراة ومبشرا برسول يأتي من بعدي اسمه أحمد... ﴾ .

جا ئەو جیاوازییە گەورەیە لەنێوان قورئان و پەیمانە کۆنەکاندا نیشانەی ئەوە نییە کە قورئان لە پەیمانە کۆنەکانەوە وەرگیرابێت؟ ئیتر بۆچی پەیمانە کۆنەکان دەلێن: محمد قورئانی لە پەیمانی کۆن و تازەوە وەرگرتووە؟ ئایا ئەم جیاوازییە گەورەیە لەنێوان قورئان و بەیەردای فەلەکاندا نیشانەی ئەوە نییە کە قورئان لەکوێ توانیویانە محمد فێربکەن؟

یان لەم سەفەرەی دواییەدا کە محمد ﷺ بە سامانی خەدیجەوە رۆیشت بۆ بازرگانی بۆ شام، بۆ نەڕۆیشت سەرێک لە بوحەیرا بدات؟ ئەگەر مەسەلەی وەرگرتن لەکاییەدا بوایە، دەبوا لەم سەفەرەدا وەری گرتبایە، چونکە لەم سەفەرەدا تەمەنی لە دەوری بیست و پێنج ساڵیدا بووە و تێگەیشتن و وریایی زیاتری هەبووە!!

بۆچی یەکێ لە هاوڕێکانی کاروانەکەی ئەم بارەوە باسیان نەکرد؟ وە غولامەکەی خەدیجە کە لەگەڵ محمد دا بوو زۆر زوو باوەڕی پێهێنا؟

یان بوحەیرا بۆچی پەناوی خۆیەوە ئەم قورئانەی بڵاونەکردەوە بۆچ تەنها بە کوڕێکی یان خزمێکی ؟ بۆ دای بە محمدێکی بێ دایک و باوک؟؟

بۆ ئەم هونەرە رەنگینەو ئەم زادەی مێشکی خۆیەی دا بە محمد؟

بۆچ نەیویست ئەم رازە گەورەیە بۆ خۆی بێ؟

تەنها وەڵامێک بۆ ئەم پرسیارانە هەمووی ئەمەیە: کە محمد ﷺ *ئەم قورئانەی لە (بوحەیرا) وەرنەگرتووە، لەوانەیە بڵێیت: ئەم رووداوە هەر نەبووە؟*

ئەگەر دەڵێن: محمد چاوی بە بوحەیرا کەوتووە و قورئانی لەوەوە وەرگرتووە، ئەوا واقیع بەدرۆیان دەخاتەوە هەروەک لەمەوپێش باسمان کرد. وە ئەگەر دەڵێن: ئەم رووداوە هەر نەبووە و چاوی بە بوحەیرا نەکەوتووە ئیتر چۆن دەڵێن قورئانی لێ وەرگرتووە.

**فەلەی دووەم :**

دووەم کەس کە لە نایینی ھەسا شارەزابوویێت و پێغەمبەر ﷺ دیبێتی (وەرەقەی کوڕی نەوفەل)ا بووە. ئەویش لەسەرەتای ھاتنەخوارەوەی یەکەم ئایەتی وەرشاندا بووە، لەکاتێکدا کە لەئەشکەوتی (حراء) یەکەم ئایەتی قورئانی بۆ ھات. فریشتەی (وەحی)ای بەئاشکرا بینی، لەشێوەیەکی بەسراوا خۆی پیشان دا لەئەنجامی ئەم چاوپێکەوتنەدا پێغەمبەر ﷺ زۆر ترساو گەڕایەوە بۆ مالّ.. وە ئەممەش دەقی ئەو فەرمودەیەیە کە خاتوو عائیشە گێڕاویەتی و ئیمامی بوخاریی و موسلیم ھەردووکیان لەکتێبی (صحیح)ەکانی خۆیاندا باسیان کردووە.

پێغەمبەر ﷺ لە ئەشکەوتی (حراء) گۆشەگیری دەکرد بۆ خۆ دوورخستنەوە لە گوناھو تاوان، بەپێی ئایینەکانی پێشوو چەندەھا شەوو رۆژ خواپەرستی دەکرد، ئەنجا دەھاتەوە بۆ مالّ بۆ لای خەدیجە.

خوارەمەمنی لەگەڵ خۆیدا دەبردو دەگەڕایەوە بۆ ئەشکەوتەکە، ئەمە پیشەی بوو تا وەحی بۆ ھات لە ئەشکەوتی (حراء) فریشتەیەک ھات بۆلای و پێی وت: بخوێنەرەوە، گوتی من خوێندەوار نیم.؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: گوشیمی بە خۆیەوە تا نارەحەت بووم و ئازارم پێ گەیشت ئەنجا بەریدام و، گوتی: بخوێنەرەوە. گوتم: من خوێندەوار نیم. بۆ جاری دووەم گوشیمەوە تا ئازارم پێ گەیشت ئەنجا بەریدام و گوتی: بخوێنەرەوە. گوتم من خوێندەوار نیم بۆ جاری سێھەم گوشیمی بە خۆیەوە، ئەنجا بەریدام و گوتی: بخوێنەرەوە. ئەم ئایەتەی بەسەرا خوێندەوە:

( إقرأ باسم ربك الذي خلق، خلق الإنسان من علق، إقرأ وربك الأكرم الذي علم بالقلم، علم الإنسان ما لم يعلم.. )

پێغەمبەریش ﷺ بەشوێن ئەوا دووبارەی کردۆتەوە.. پاش ئەوە پێغەمبەر ﷺ دلّی دەکەوێتە تەپەتەپ و ترسی لێ دەنیشێ، دەگەڕێتەوە بۆ مالّ بۆلای خەدیجەی خێزانی و دەفەرموێ: ( داپۆشن داپۆشن ) ئەوانیش دایان پۆشی ھەتا ترسەکەی نەما، ئەنجا بەسەرھاتەکەی خۆی بۆ خەدیجە گێڕایەوەو گوتی: لەخۆم دەترسم، خەدیجەش پێی گوت: مەترسە وەللاھی ھەرگیز خوا سەرشۆڕت ناکات، چونکە بێگومان سەر لە خزم و خوێش دەدەیت و، یارمەتییان دەدەیت، بەھاواری یەکەوتووانەوە دەچیت،

دەستی لێئەوماوان دەگریت، کۆمەکی بە نەبوان دەکـەیت، میـوان نەوازیت، پشت گیری لە هەق دەکەیت.. ئەنجا خەدیجە بردی بۆلای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کە ئـامۆزای بوو، ئـەم پیـاوە لـەسەردەمی نەفامی‌دا بوو بوو بە فەلـە، وازی لـە بت پەرستی هێنـابوو فێـری نووسینی عیبرانی بوو بوو، تا خوا مەیلی لێبێ بـەزمانی عیبرانی ئینجیلی دەنووسیەوە، ئەم پیاوە پیربووبوو لەبـەر پیری چاوەکانی کوێر بووبوون، خەدیجە پێی گـوت: ئـامۆزا! گوێبگـرە لـەم برازایەت، ئەویش گوتی: برازای خـۆم چیت بەسـەر هـاتووە؟ پێغەمبەریش ﷺ بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە. ئەنجا وەرەقـە پێی گوت: ئەوەی تۆ دیوتە هەر ئەو فریشتەیە کە خوا ناردوویـەتی بۆ لای مووسا، خۆزگـا بمامایەو گەنج بومایە، لـەو کاتـەدا خزمەکانت دەریان دەکردی.. پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: بۆچ ئـەوان دەرم دەکەن!! گوتی: بەڵێ هیچ پیاوێک نییـە وەحی بـۆ هـاتبێ و دوژمنایەتی لەگەڵا نەکرابێ، ئەگـەر بکەومـە ئەو کاتـە بەهـەمـوو هێزمەوە پشت گیریت دەکـەم، پـاش ئـەوە زۆری پێنەچوو وەرەقـە مرد، (وەحی)یش وەستا .

بەڵێ پێغەمبـەر ﷺ تـەنها ئـەوەندە چـاوی بـە (وەرەقـە) کەوتووە، ئایا لە ماوەی ئەم چاوپێکەوتنەدا خێرا هـەمـوو قورئـانی بۆ لەبەرکرا؟

قورئانێک کە پچر پچر هاتۆتـەخوارو لـەماوەی بیسـت و سێ سالدا، چۆن وەرەقـەی بەستەزمان ئەمەی زانی کـە پـاش حـەوت هەشت سـالی تر پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵ گـەورەپیاوانی قورەیشـا ڕادەوەستێ، بەو هیوایەی دڵیان بەتیشکی بـاوەڕ ڕووناک بێتـەوە، لەو کاتی قسەکردنەدا موسلمانێکی کوێر دێت و، پرسیار لـە پێغەمبەر دەکات، یەکەم جار پێغەمبەر ﷺ وەڵامـی نـاداتـەوە بۆ جاری دووەم کە پرسیار دەکاتەوە پێغەمبەر ﷺ ڕووگرژ دەکـات بۆ سێیەم جار کە پرسیاری کرد پشتی تێکرد، بەڵام چـەندەها ئایـەت هاتنەخوارەوەو بـەم بۆنەوە لۆمـەی پێغەمبـەری تیـادەکرێ، تـا دەرسێک بێت بۆ پێغەمبـەر ﷺ و هەمـوو موسلمانێکی تریـش تـا ڕۆژی قیامەت کە موسلمانێکی خاوەن باوەڕ با کوێر بێ و هـەژار، لەلای خوا زۆر گـەورەترە لـەو زەبەلاحانـەی کـە لـە ڕوانگـەی نەفامیەوە بـە خـاوەن سـامان و پلەو پایـە دەناسرێن و، ڕێزیـان لێدەگیرێ، لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا ڕێـز بۆ پلەو پایەو سامان

وەعشرەت زۆری نیە، بەڵکو تەنها بۆ ئەو کەسەیە کە خواپەرست و خزمەتگوزاری موسوڵمانان بێ..

(وەرەقە) چۆن ئەمەی زانی کە کوێرێک دێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ؛ تا بۆی بنووسێ:

(عبس وتولى أن جاءه الأعمى وما يدريك لعله يزكى..) عبس/ ١-١٢.

یان وەرەقەی هەژار ئەمەی چۆن زانی کە پاش چواردە ساڵ ئەمان کۆچ دەکەن بۆ مەدینەو لەناوچەی (بەدر)دا شەڕێک لەنێوان موسوڵمانان و بت پەرستانا روودەدات و ژمارەی موسوڵمانەکان زۆر کەمەو ژمارەی ئەوانیش زۆر زۆرەو، لە ئەنجامدا موسوڵمانەکان بەسەریانا سەردەکەون و حەفتا دیلیان لێ دەگرن و بەڵام پێغەمبەر ﷺ بە پارە بەرەڵلایان دەکات و ئەنجا سەرزەنشتی بکات و بڵێ:

(ماكان للنبي أن يكون له أسرى حتى يثخن في الأرض تريدون عرض الدنيا والله يريد الآخرة والله عزيز حكيم. لولا كتاب من الله سبق لمسكم فيما أخذتم عذاب عظيم..) الأنفال/٦٨.

لۆمەی پێغەمبەری کردوە کە بۆچ ئەی کوشتوون؟ ئەمانەو چەندەها وێنەی تری وەک ئەمانە زۆرن لە قورئاندا (وەرەقە)ی بەسەزمان ئەمانەی چۆن زانی؟

**تێبینی:**

بەسەرهاتی هاتنەخوارەوەی (وەحی)و رۆیشتنی پێغەمبەر ﷺ بۆلای (وەرەقە)م لە کتێبی (جواهر البخاري) وەرگرتووە لە لاپەرەی (٣-٥) چاپی قاهیرە.

ئەم کتێبانەش زانیاری زیاتریان تێدایە دەربارەی ئەو بابەتە:

١- ژیانی پێغەمبەری ئەمزن، عبدالعزیز پارەزانی، بەرگی یەکەم لاپەرە ٨٨-٨٩ و ١٣٠-١٣٢.

٢- ژیانی پێغەمبەری مەزن، عبدالعزیز پارەزانی، بەرگی دووهەم لاپەرە ١٤-١٥.

٣- نورة محمد من الشك الى اليقين لاپەرە ٥٥-٥٦.

---

ئەم بابەتە لە کتێبی (ئێستا دڵنیام) بە کەمێک دەستکارییەوە وەرگیراوە.

# پێرست

